پرۆژەی
نوری ڕێ



-زنجیرە باسی-

# ئیمام مەهدی بەڕێوەیە

لەڕێی ئەو فەرموودانەی کە بەشێک یان زۆربەی
هاتوونەتەجێ و بەشێکی کەمیان لێ ماوە لە واقیع ڕوبدەن

نوسینی

دکتۆر علی حسێن دووسەرەیی رحمه الله

-زنجیرە باسی-

# ئیمام مەهدی بەڕێوەیە

**لەڕێی ئەو فەرموودانەی کە بەشێک یان زۆربەی**
**هاتوونەتەجێ و بەشێکی کەمیان لێ ماوە لە واقیع ڕوبدەن**


نوسینی

دکتۆر علی حسێن دووسەرەیی رحمه الله

ئامادەکردنی

نـــــوری ڕێ



١٤٤٢ی کۆچی/ ٢٠٢٠ی زاینی

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ
عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن
يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا ٢٣

سُورَةُ الأَحزَابِ

لەناو ئەو بڕوادارانەشدا پیاوانی وایان هەبوو، ئەو پەیمانەی بە اللەیاندابوو، ڕاستیان لەگەڵ کرد و، زۆر بەباشیش پابەندبوون پێوەی و لایان نەدا لێی. ئینجا هەشیان بوو نەزر و پەیمانی خۆیان بردە سەر و شەهیدبوون، هەشیان بوو هەردەم لەچاوەڕوانی شەهیدبوون دابوو لەڕێی اللەدا. بەهیچ جۆرێکیش پەیمانی خۆیان نەگۆڕی..

# ناونیشانی بابەتەکان

## ئیمام مەهدی بەڕێوەیە

**٦**
زنجیرەی یەکەم
ئەو فیتنەیەی لە سوریا هەیە چۆن دەستی پێکرد و نهێنی ئەم وێنانە چیە!

**٣٠**
زنجیرەی پێنجەم
-بەشی سێیەم-
نەوت لەسەردەمی محمدی مەهدی لە صحيح "موسلم"دا!

**٤٣**
زنجیرەی یانزەیەم
ئایا کەسێك هەیە کە گومانی لێبکرێ محمدی مەهدی بێت؟

**٨**
زنجیرەی دووەم
ئایا بومەلەرزە شتێکی چاوەڕوانکراو بوو لەلایەن خۆشەویستانی محمد مەهدی؟

**٣٢**
زنجیرەی شەشەم
بنەماڵەی ئال سعود.

**٤٥**
زنجیرەی دوانزەیەم
ئایا محمدی مەهدی پێش دەرکەوتنی کەسێکی خراپە؟

**١٠**
زنجیرەی سێیەم
ئایە دەتوانین بەگوێرەی حەدیسەکان کاتی دەرکەوتنی محمدی مەهدی دیاری بکەین بە نزیکەیی ساڵ؟!

**٣٣**
زنجیرەی حەوتەم
٣٥ سیفەتی محمد مەهدی هەروەك بڵێیت بە چاوی خەیاڵ دەیبینیت.

**٤٨**
زنجیرەی سیانزەیەم
وەڵامێك بۆ مامۆستا هاوڕێ.

**١٣**
زنجیرەی چوارەم
چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەل حەدیسی ضەعیف لە باسکردنی ڕووداوەکانی ئاخیر زەمان.

**٣٧**
زنجیرەی هەشتەم
دەرکەوتنی محمد مەهدی لە دوای منصور اليماني.

**٤٩**
زنجیرەی چواردەیەم
ڕاست هەڵەیەك سەبارەت بە دەرکەوتنی شاخە ئاڵتونیەکە.

**٢١**
زنجیرەی پێنجەم
-بەشی یەکەم-
ئایا محمد مەهدی لەم سەردەمە پێشکەوتووە دێت یان ئەم پێشکەوتنە نامێنێ؟؟

**٣٩**
زنجیرەی نۆیەم
حاڵی محمد مەهدی علیە السلام پێش دەرکەوتنی.

**٢٦**
زنجیرەی پێنجەم
-بەشی دووەم-
چەکە پێشکەوتووەکان لە جەنگە گەورەکەی محمدی مەهدی.

**٤٢**
زنجیرەی دەیەم
جەنگی قەرقیسیا.

لەبەرواری ٧ی زوالقعدەی ١٤٤١ ئامادەکراوە

٢٠٢٠ / ١٤٤١




# پێشەکی

بسم الله والحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله، أما بعد. إن شاء الله دەست بە باسکردنی چەند حەدیثێک دەکەم دەربارەی نزیکبوونەوەی دەرکەوتنی (محمدی مەهدی) بۆئەوەی موسڵمانان چاوکراوە بن و، لە هەموو کەسێک زیاتر ئاگاداری ئەم واقعە تاڵە بن. هەروەها لە فیتنەکان شارەزابن و بزانن چی چاوەڕێیانە لەم چەند ساڵە لە پێشهاتی نویێ و، بزانن پێغەمبەر (ﷺ) چۆن باسی ڕووداوەکانی ئەم سەردەمەی کردووە، بەجورێک کە باسی سەرۆکی ئێستای ئەمریکا ترامپ بکات.

لە زنجیرە باسی محمد مەهدی إن شاء الله لەو حەدیثانەوە دەست پێدەکەین کە بەشێک یان بەشێکی زۆر لە حەدیثەکە هاتووەتەجێ و بەشێکی کەمی ماوە لە واقع ببینین. بۆئەوەی گەورەیی ئەم دینە بزانین لە باسکردنی موستەقبەل و ئومێد لە دڵی موسڵمانان بڕوێتەوە. هەروەها دڵە نەخۆشەکانیش بزانن کەوا ناکرێت بڕوات بە حەدیث نەبێت. واتا بە غێر موباشەریش وەڵامێک بێت بۆ ئەوانەی بڕوایان بە حەدیس نییە. بەپشتیوانی خودا زۆربەی حەدیث و ئەثەرەکان ئەوانەن کە پێشتر زۆر بەکەمی باسکراوە یاخود هەر نەبیستراوە (ئەمەش فەضڵی خوایە لەسەرمان).

✍ **دکتۆر علی دووسەرەیی**

**١٤٣٩ی کۆچی / ٢٠١٨ی زاینی**

# ئەو فیتنەیەی کە لە شام (سوریا) وە سەرهەڵدەدات و هەتاکو مەهدی (علیه السلام) نەیات کۆتایی پێنایات!

وێنەی هەمزە






وێنەی یەکێکی تر لە دروشمەکان کە نوسیبوویان (إرحل یا بشار)!




وێنەی یەکێک لەو دروشمەی کە هەمزە و هاورێکانی لەسەر دیواری قوتابخانەکەیان نوسیبوویان (أجاك الدور یا دکتور)!




وێنەی قوتابخانەی(الأربعین)

# نهێنی وێنەکان بزانە

# زنجیرەی یەکەم:

## ئەو فیتنەیەی لە سوریا هەیە چۆن دەستی پێکرد و نهێنی ئەم وێنانە چییە!

پێغەمبەر (ﷺ) لە حەدیثێکدا کە "سعیدی کوری مسیب" دەیگێڕێتەوە، دەفەرموویت: (**تكون فتنة بالشام, كأن أولها لعب الصبيان, كلما سكنت من جانب طمت من جانب (آخر)، فلا تتناهى حتى ينادي مناد من السماء: ألا إن الأمير فلان، وفتل ابن المسيب يديه حتى إنهما لينفضان، فقال: ذلكم الأمير حقا، ثلاث مرات**). وفي رواية اخرى (**حتى ينادي مناد من السماء يسمع أهل كل لغة بلغتهم، يعم أهل الأرض جميعا ألا إن أميركم فلان فذالكم المهدي حقا فذالكم المهدي حقا**). وفي رواية اخرى (**حتى تبلغ بقيع الغرقد**). وفي رواية اخرى (**وتطلع كف تشير**).

واتا: فیتنیەک لە سوریا سەرهەڵدەدات سەرەتاکەی یاری منداڵانە، لە شوێنێک دابمرکێت لەشوێنێکی تر سەرهەڵدەدات. کۆتایی پێ نایات (لە ڕێگا چارەیەک دەگەڕێن نایدۆزنەوە) هەتاوەکو دەنگێک لە ئاسمانەوە بانگ دەکات: "ئەمیرەکەتان فڵان کەسە". ڕاوی حەدیثەکە دەستەکانی گوشینە سەر یەک وەک بڵێیت شتێکی لێ دەتکێت و، سێ جار گوتی: "ئەوە ئەمیرە ڕاستەقینەکەتانە". لە ڕیوایەتێکی تر (دەنگێک لە ئاسمانەوە دێت. هەموو گەلێک بە زمانەکەی خۆی گوێی لێدەبێت هەموو گەلانی سەر زەوی دەگرێتەوە. ئەمیرەکەتان فڵان کەسە ئەوەش مەهدی ڕاستەقینەیە ئەوەش مەهدی ڕاستەقینەیە، ئەوەش مەهدی ڕاستەقینەیە). هەروەها لە ڕیوایەتێکی تر ئەم فیتنەیە دەگاتە "بەقیعی غەرقەد"[١]، ئنجا ئەو دەنگە دێت. لە ڕیوایەتێکی تر (دەستێک دەردەکەوێت ئاماژە بۆ ئەم ڕوداوە دەکات).

(١) مەبەست پێی سعودیەی ئێستایە کە گۆڕستانی بەقیعی لێیە و بە بەقیعی غەرقەدیش ناودەبرێت.




ئەوەی جێی باسە فیتنەی سوریا لە ساڵی ٢٠١١ سەری هەڵدا کە بەمشێوەیە بوو. ئەو کوڕەی کە لە وێنەکەدا دیارە ناوی "حەمزە"یە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی لە شاری "درعا" لە مەدرەسەی "أربعينية" لەسەر دیوار ئەم عیباراتانەیان نوسی بوو: (ارحل یا بشار)! (جاك الدور یا دكتور)! واتا بڕۆ ئەی "بەشار"! نۆرەی تۆش هات ئەی دکتور! پاشان ئەمانە هاتنە گرتن و کوشتن لەلایەن ئەمنی سوری و عائیلەکانیان لەگەڵ خەڵکی ئەو شوێنە موزاهەرەیان کرد. ئەمنی سوری لەوێ بێدەنگی کردن و پاشان لەشارەکانی تر سەری هەڵدا، وەک (حمص، حلب، دیمەشق... و باقی شوێنەکانی تر). هەروەک بینیان ئێستاش بەدوای چارەسەرێک دەگەڕێن هیچ ڕێگە چارەیەک نادۆزنەوە (جامیعەی عربی، جنیف١، جنیف٢، ئومەمی موتتەحیدە..... ئەم جورە مرۆڤانە) و لایەنەکانی تریش.




## ئەوانەی جێی ئاماژەن:

ئەوانەی کە لە حەدیثەکەدا کە هاتوونەتەجێ (یاری منداڵان، ئارام نەبوونی وەزعەکە، گەیشتنی فیتنەکە بە سعودیا کە ماوەیەکی زۆر نییە ڕوویداوە و، ئێستا فیتنەکە بەرەو لوتکە دەڕوات کە مزگێنی گەورەی لە دوادایە إن شاء الله، لە داهاتوو دێینە سەری. دەرکەوتنی ئەو دەستەی کە ئاماژە دەکات بە دەرکەوتنی محمد مەهدی هەروەک لە وێنەکەدا دیارە کە وەکالەی ناسای ئەمریکی بڵاوی کردووەتەوە).







## ئەوەی چاوەڕوان دەکرێت:

(دەنگەکە بێت) ئەگەر ڕیوایەتەکان کۆبکەیتەوە، بۆت دەردەکەوێت ئەم دەنگە مەبەست پێی کەناڵە ئاسمانیەکانە کە لە تەلەفیزیۆنەکانەوە بەهەموو زمانێک پەخش دەکرێت و هەموو خەڵک دەیبیستێت. (بێگومان کە محمد مەهدی بەیعەتی پێ بدرێت هەواڵەکان هەر باس لەوە دەکەن).

## ئەوەی من بۆی دەچم واللّٰه أعلم:

کاتێک محمد مەهدی بەناو سعودیەی ئێستا فەتح دەکات (هەروەک لە حەدیثەکەدا هاتووە). ئەو هەموو کەناڵەی لەبەر دەست بێت کە لەوێ پەخش دەکرێت، بێ گومان سەرخەرانی محمد مەهدی پەخشی بەیعەتی دووەمی بۆ دەکەن کە ١٢٠٠٠ بۆ ١٥٠٠٠ کەس بەیعەتی پێ دەدەن. ئەمەش یەکێکە لەو بەڵگانەی کە محمد مەهدی لەم سەردەمەدا دێت، لەم پێشکەوتنەی ئێستادا (هەروەک لە داهاتوودا بە بەڵگەی حاشا هەڵنەگر إن شاء الله بۆتانی ڕووندەکەمەوە).

# زنجیرەی دووەم:

### ئایا بومەلەرزە شتێکی چاوەڕوانکراو بوو لەلایەن خۆشەویستانی محمد مەهدی؟[١]

بەڵێ بەڕاستی لامان چاوەڕوانکراو بوو. تەنانەت چەند مانگێک پێش حەجی ئەمساڵ زور چاوەڕوان بووم، هەتا جارێکیان برادەرێک لێمی پرسی، چی ماوە ڕووبدات؟ منیش

(١) تێبینی: بومەلەرزەی مەبەست دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی ساڵی ٢٠١٧، چونکە ئەم بابەتە ئەو کات نوسراوە.



پێم گوت بومەلەرزە دەبێت زوربێت! سبحان الله، دوای فەترەیەکی کەم بومەلەرزە هەموو دونیای گرتەوە هەروەک لای هەمووان ئاشکرایە. بۆچی بومەلەرزە؟!

چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت: (**أُبَشِّرُكُمْ بِالْمَهْدِيِّ، يُبْعَثُ فِي أُمَّتِي عَلَى اخْتِلَافٍ مِنَ النَّاسِ وَزَلَازِلَ، فَيَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلًا، كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا، يَرْضَى عَنْهُ سَاكِنُ السَّمَاءِ وَسَاكِنُ الْأَرْضِ، يَقْسِمُ الْمَالَ صِحَاحًا. فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ : مَا صِحَاحًا ؟ قَالَ: بِالسَّوِيَّةِ بَيْنَ النَّاسِ**).

واتە مزگێنیتان دەدەمێ بە هاتنی مەهدی لەسەردەمێکدا کە ناکۆکی لەناو خەڵکدا زۆرە، هەروەها بومەلەرزەش. زەوی پڕ دەکات لە یەکسانی و دادپەروەری هەروەک چۆن پڕ بووە لە زوڵم و ناعەدالەتی و، پارە بە یەکسانی لە نێوان خەلک دابەش دەکات.

بۆیە موسڵمانان بزانن کەوا بومەلەرزەی زیاتر بەڕێوەیە هەروەک چۆن ئێستا خیلاف لەناو خەڵکی دا زۆرە، تا ئەو کاتەی محمد مەهدی دەردەکەوێت، پێویست ناکات چاوەڕێی ئەم و ئەو بکەین، بەڵام با تەوبە بکەین. والله أعلم بەڵام ئەم بومەلەرزانەش دەبنە هۆکارێک بۆ ئەوەی خەڵکەکە زیاتر ڕوو لە خوا بکات. چونکە محمد مەهدی پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر موجاهید هەیە تاوەکو شەڕی هەموو جیهان بکات.

چونکە لەشکرێکی نزیکەی یەک ملیۆن کەسی (٩٦٠٠٠٠) ئامادە دەکات. (.......**فيجمع لهم أهل الإسلام مثل ذلك**).

بڕیارڕ وابوو باس لەوە بکەم کە چەندی ماوە بە تەقریبی بەپێی حەدیثەکان، بۆ دەرکەوتنی ئیمام مەهدی بەڵام لەبەر ڕووداوەکانی ئەمڕۆ بابەتەکەم گۆڕی.

# زنجیرەی سێیەم:

ئایا دەتوانین بەگوێرەی حەدیسەکان کاتی دەرکەوتنی محمدی مەهدی دیاری بکەین بە نزیکەییساڵ؟!

**بەڵێ، بەپێی ئەم سێ حەدیسە:**

**حەدیسی یەکەم :**

ئەبو هورەیرە ڕیوایەتی دەکات: (**يبايع لرجل بين الركن و المقام ، و لن يستحل البيت إلا أهله، فإذا استحلوه فلا تسأل عن هلكة العرب**).

کەسێک بەشێوەی نادیار لەنێوان "ڕوکن" و "مقام" بەیعەتی پێدەدرێت و کەس استیحلالی حورمەتی ماڵی خوا (کەعبە) ناکات خەڵکی ئەو شوێنە نەبن. (واتا کوشتاری تێدا دەکەن، ئەگەر ئەم کارەیان کرد ئەوا لە لەناوچونی عەرەب مەپرسە. واتە زۆر ناخۆشی و کوشتار لە دوای ئەم کارە یەک بەدوای یەک لەناویاندا ڕوودەدات کە دەبێتە هۆی لە ناوچونیان بەزۆری کە هەلاکەتە بۆیان).

### ئایا ئەم حەدیسە هاتووەتەدی؟

لەگەڵ بەیانی ١ی محرم ١٤٠٠ کۆچی، کە دەکاتە ١ی نۆڤەمبەر ١٩٧٩ زاینی "محمدی کوڕی عبدالله القحطاني" لەگەڵ خەزورەکەی "جوهەیمان" لەگەڵ ٢٠٠ کەس بەنهێنی

چەکیان هەڵگرتبوو و خویان ئامادەکردبوو هەر کە نوێژی بەیانی تەواو بوو، ڕایانگەیاند کە "محمد القحطانی" محمدی مەهدییە. چونکە لە خەودا بینی بووی بە خەزورەکەی گوتبوو: لە دەست دوژمنانی خوا ڕایان کردووە خۆی بە کەعبە پەناداوە "محمد القحطانی" لە بانگخوازان بوو ئەو لەگەڵ زاوایەکەی کە ناوی "جوهەیمان" بوو قوتابی "ابن باز" بوون. ئەو سیفەتانەی دەربارەی محمدی مەهدی هاتوون بەشێکیان لەم کەسەدا دەهاتنەجێ. ئەوەبوو بەیعەتی پێدرا و ماوەی (١٦) ڕۆژ مەککەیان کۆنتڕۆڵکرد. پاشان قوواتی سعودی بە هاوکاری قوواتی ئوردنی و خوبەرای فەڕەنسی، محمدی قەحطانیان کوشت و جوهەیمانیشیان لە سێدارەدرا.




ئەوەی مەعلومە لە دوای ساڵی ١٩٧٩ و هەشتاکانەوە تاکو ئێستاش حاڵی عەرەب دیارە چیان بەسەر هاتووە. چۆن بەهەلاکەت چوونە، هەروەک لە حەدیسەکە ئاماژەی پێکراوە. واتە حەدیسکە هەر سێ بەشی هاتووەتەجێ!

١. بەیعەت بەکەسێکی نادیار درا.
٢. شەرکرا.
٣. عەرەبیش لەهەلاکەت دەژین.

**واتا ئەوەی یەکەم محمدی مەهدی نییە! ئەی کەواتە کەی کاتی ئیمام مەهدییە؟**

## حەدیسی دووەم:

ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (**سيعوذ بهذا البيت – يعني مكة – قوم ليس لهم منعة ولا عدة ، يبعث لهم بجيش حتَّى إِذَا كَانوا بِبَيدَاءَ منَ الأَرضِ خُسِفَ بِهم**)[١].

واتا خەڵکانێک خۆیان بە مەککە پەنا دەدەن چەک پاسەوانیان لەگەڵ نییە، جەیشیک بۆیان بەڕێ دەکەوێت هەتاوەکو دەگەنە شوێنێک لەنێوان مەککە و مەدینە ڕۆدەچن لە زەویدا.

شتێك لێرە گرنگە بیزانین محمدی مەهدی ڕاستەقینە کاتێک بەیعەتی دەدرێتێت خۆی و جەماعەتەکەی چەکیان پێ نییە و ئەو جەیشەی بۆ لە ناو بردنی محمدی مەهدی بەڕێدەکەوێت. خوای گەورە لە زەویدا دەیانباتە خوارێ.

## ئێستاش هەواڵە خۆشەکە لە حەدیسی سێیەم :

کە خیلاف هەیە، ئایا حەدیسە یان ئەثەرە کە بە مەرفوعی دەگاتە پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەش دەقەکەیە: (**سيعوذ بمكة عائذ ، فيقتل، ثم يمكث الناس برهة من دهرهم، ثم يعوذ عائذ آخر، فإن أدركته فلا تغزونه فإنه جيش الخسف**)[٢].

کەسێک خۆی بەکەعبە پەنادەدات و دەکوژرێت. پاشان خەڵکەکە بورهەیەک لە ژیانیاندا بەسەر دەبەن. ئنجا کەسێکی تر خۆی بە کەعبە پەنا دەدات[٣]، کە گەیشتن بەو

---

(١) رواه مسلم في صحيحه و رقمه ٢٨٨٣

(٢) رواه نعيم بن حماد بكتابه الفتن.

(٣) واتا ئەوانەی ڕووداوی یەکەمیان بینیوە بەشێکی زۆریان ڕووداوی دووەمیش دەبینن.

ڕۆژە شەڕی ئەو کەسە نەکەن چونکە بە زەویدا ڕۆدەچن جگە لەوەی هەواڵە خوشەکەمان دەداتێت.

ئەم وشەی (برهة)یە کە لە زمانی عەرەبی بە (٣٥) تا (٤٠) ساڵ تەقدیر دەکرێت. هەروەک "ابن عباس" دەفەرموویێت بورهە (٣٥) ساڵ و دەوروبەریتی (٣٥ ونحوها) لەوانەیە هەندێکجار هەتا (٤٥) ساڵیش بە بورهە حساب بکەن.

ئێستا حەدیسەکان بەیەکەوە ببەستەوە و بەشێوەیەکی پانورامی تەماشای بکە بۆت دەردەکەوێت.

# زنجیرەی چوارەم:

## چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەل حەدیسی ضەعیف لە باسکردنی ڕووداوەکانی ئاخیر زەمان.

پێش باسکردنی بابەتەکە دەمەوێت ئاماژە بە شتێک بکەم، ئەویش ئەوەیە کە بەشێکی زۆری حەدیسەکانی ئاخیر زەمان، ئەگەر بکرێت دەتوانین بڵێین موشەفەرن. کە هەندێک ڕەمزی تێدایە لە جیلێکەوە بۆ جیلێکی تر دەگوازرێنەوە بێ ئەوەی  بکرێنەوە، تاوەکو دەگات بە ڕۆژگارێک کە واقیع خۆی دەیکاتەوە. ئنجا خەڵک تێیدەگات، لە زنجیرەی پێنجەم ئەمجۆرە حەدیسانە زیاتر باس دەکەین إن شاء الله.

بۆنموونە لە باسی محمد مەهدی لە حەدیسدا هاتووە کە محمد مەهدی لە ماوەیەکی کەم، چەند ڕۆژێک دێتە "مەککە" و دەگەڕێتەوە "مەدینە" بەپێچەوانەشەوە کە دووری نێوانیان نزیکەی (٤٠٠) کم دەبێت. زانایانی پێشتر کە ئەم حەدیسەیان شەرح دەکرد دەیان گوت: خوا کەرامەتی داوەتێ، زەوی بۆ لێک نزیک دەکاتەوە. بێگومان خوای گە ورە کەرامەتی پێداوە، بەڵام لەم سەردەمە پێویست ناکات بۆ ئەم هاتن و چوونە بڵێین پێویستیت

بە کەراماتە. بەڵکو پێویستت بە سەیارەیە[١]. جا هەرکەسێک دەیەوێت شارەزایی هەبێت لە (فقه التحولات) زانستی گۆرانکاریەکان دەبێت ئاگاداری ئەم شتانە بێت و حەدیسە زەعیفەکانیش پشت گوێ نەخات. زۆر بەداخەوە ئەم زانستەی کە باسم کرد، (فقه التحولات) زۆر پشت گوێ خراوە، جا لەبەر هەر هۆکارێک بێت.

ئەمەی خوارەوە باسێکی چڕ و پڕە لە بارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ حەدیسی (ضعیف)، چونکە دوای باسکردنی بەشێک لە ڕووداوەکانی ئاخیری زەمان و محمدی مەهدی. لای زۆرێک ئەم پرسیارە پەیدا دەبێت، ئایا ئەم حەدیثانەی باسی ئەم ڕووداوانە دەکەن (صحیحن)؟! ئایا دەبێت بڕوامان پێی هەبێت؟ ئایا ئەم حەدیسە لەگەڵ ئەوەی کە (ضعیفە)، بەڵام لە واقع هاتەجێ، ئایا ئەم حەدیسە هەرچەندە (ضعیفە) بەڵام بەشێکی هاتووەتەجێ، دەکرێت چاوەڕێی بەشەکەی تری بکەین؟ هتد... بەتایبەتی لەلای بەشێک لە (طالب علم)ەکان. بۆیە بەپێویستم زانی لەم زنجیرەیە باسی ئەم بابەتە بکەم و کۆمەڵێک دەلیل لە قەولی زانایانی حەدیث لەم بارەیەوە بخەمەڕوو لە محازەرەی یەکێک لە شێخە پایە بەرزەکان. بۆ ئەوانەی کە عەرەبی نازانن بەکورتی کوردیەکەیان بۆ باسدەکەم، چونکە مەوضوعەکە درێژە و بۆ طالب علمەکانیش عەرەبییەکە کافیە.

"ابن تیمیە" (رحمه الله) لە (مجموع)دا دەڵێت: حەدیثی (ضعیف) ئەوەیە کە کەسێک ڕیوایەتی کردووە کە ڕاستگۆییەکەی نەزانراوە (غیر موثوق)، لەبەر خراپی لەبەرکردنەکەی یان لەبەر تۆمەتباری کەسایەتییەکەی. لەوانەیە ڕاستیش بێت، چونکە کەسی فاسقیش دەکرێت قسەی ڕاست بکات و، کەسێکیش کە زۆر هەڵە بکات لەوانەیە جاری وا هەبێت بتوانێت بەتەواوی لەبەری بکات (حفظ).

(١) بۆ زانین: هەروەها ئەو زانایانەی بەیعەتی دەدەنێ کە ژمارەیان (٧) زانایە هەمان هاتن و چونیان دەبێت کاتێک بەدوای دەگەڕێن.

"سیوطي" (ﷺ) لە (تدريب الراوي) دەربارەی حەدیثی وەرنەگیراو (غير مقبول)دا دەڵێت: واتا سەنەدەکەی (صحيح) تەواو نییە لەسەر ئەو مەرجانەی کە دانراون، نەوەک حەدیثەکە لە خودی خۆی ڕاست نەبێت. لەبەر دروستی وتنی قسەی ڕاست لەلایەن کەسی درۆزن و پێکانی کەسێک کە زۆر هەڵە بکات.

هەروەها زانا "حمود التويجری" لە کیتابەکەی (اتحاف الجماعة في أشراط الساعة)دا دەڵێت: هەندێک لەو پێشهاتانەی کە دەنگوباس بە ڕوودانیان هاتووە ڕیوایەت نەکراون، مەگەر لە چەند ڕێگایەکی ضەعیفەوە نەبێت. لەکاتێکدا ڕاستی زۆریان بەدەرکەوت بەتایبەتی لەم سەردەمەی خۆمان. پێش نزیکەی (١٠٠) ساڵ تەقریبەن ئەم قسەی کردووە کە ئەمە خۆی لە خۆیدا ئاماژەیە بۆ ڕاستی ئەم ڕیواتانە و شاهیدی واقیعیش بەسە بۆ بەڕاست سەلماندن و ئاماژەدان بەدەرچوونی ئەو جۆرە قسانە لە سەرچاوەی ڕووناکی نوری پێغەمبەرایەتی.

هەروەها "الكنوي" لە (الأماني للجرجاني)دا لە "ابن عبدالبر"وە دەگێڕێتەوە لە (الأستعاب) کاتێک قسە لەسەر حەدیثێک دەکات دەڵێت: ئەم حەدیثە (ضعيفه) لە ڕووی سەنەدەوە. بەڵام واقیعەکەی (صحيحه) و، ئەگەر خوای گەورە لەسەر ئەهلی کیتاب لە باس و وەسفی پێغەمبەر (ﷺ) کیتابەکەی خۆیانی بەسەریان کردبێتە بەڵگە لەکاتێکدا کە دەستکاری (تحريف) کراوە و هیچ سەنەدی نییە. خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡۖ﴾ ، هەروەها دەفەرموویێت: ﴿ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ﴾. ئەو حەدیثانەی کە مطابق دەردەچن لەگەڵ واقع لە باسی جەنگەکان (الملاحم)، مەبەست پێی ئەو زنجیرە جەنگەی کە بە جەنگی گەورە کۆتایی دێت و فیتنەکانی ئاخر زەمان، هەتا ئەگەر سەنەدەکەشی (ضعيف) بێت ئەوە ئەم حەدیثە حەدیثێکی ڕاست و ئاشکرایە یاخود ڕاستییەکی ئاشکرایە.

لەکۆتایی بەشە کوردییەکە دەمەوێت قسەیەکی زۆر جوانی یەکێک لە عالمەکانی (فقه التحولات)تان بۆ بکەم کە دەڵێت: ئەگەر کەسێکی درۆزن هات ووتی: لە پشت ئەم خانووە ئاگرێک بەربووەتەوە. ئێمەش هەر کە ئاوڕمان دایەوە بینیمان دووکەڵ بەرز دەبێتەوە، ئایا دەکرێت بڵێین درۆیە؟! درۆزنە، بەڵام ڕاستی کرد.

جا موسڵمانان ئێمە سونەتێک لەناومان هەیە کە خۆی لە خۆیدا شەیتان بە "ئەبو هورەیرەی" گوتووە، کاتێک هاتبووە سەر شێوەی مرۆڤێک، حەدیثەکە مەشهورە. پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو: (**صدقك وهو كذوب**). واتا ڕاستی پێتگوت، بەڵام خۆی درۆزنە. بۆ ئەوانەی حەزیشیان لێیە(طالب العلم)ن لە بەشە عەرەبییەکە شتی زۆر بەسودی تێدایە، خوای گەورە بۆ خۆی حیسابی بکات و پاداشتی هاوکارانم بداتەوە لە نوسینەوەی ئەلیکترۆنی.

## المطلب الأول العمل بالحديث الضعيف:

قال ابن تيمية في المجموع: (والضعيف الذي رواه من لم يعلم صدقه أما سوء حفظه وأما لإتهامه ولكن يمكن أن يكون صادقا فيه فان الفاسق قد يصدق والغالط قد يحفظ).

وقال السيوطي في تدريب الراوي عن الحديث الغير المقبول: (معناه لم يصح اسناده على الشرط المذكور لا أنه كذب في نفس الامر لجواز صدق الكاذب واصابة من هو كثير الخطأ).

وقال النووي في المجموع: (قد قدمنا اتفاق العلماء على العمل بالحديث الضعيف في فضائل الاعمال دون الحلال والحرام وهذا من نحو فضائل الاعمال). وفي فتاوى الرملي: (حكى النووي في عدة من تصانيفه اجماع اهل الحديث على العمل بالحديث الضعيف في الفضائل ونحوها خاصة). وفي مواهب الجليل للخطاب وشرح الفرشي على خليل: (فقد اتفق العلماء على جواز العمل بالحديث الضعيف في فضائل الاعمال).

وقال علي القارئ في الحظ الاوفر كما في الاجوبة الفاصلة للكنوي: (الحديث الضعيف معتبر في فضائل الاعمال عند جميع العلماء من ارباب الكمال) وقال القارئ في رسالته في الموضوعات كما في الاجوبة الفاصلة للكنوي: (الضعيف يعمل به في فضائل الاعمال اتفاقا).

وقال ابن حجر الهيثمي في شرحه على الاربعين النووية: (قد اتفق العلماء على جواز العمل بالحديث الضعيف في فضائل الاعمال لانه ان كان ضعيفا في نفس الامر فقد أعطى حقه العمل به وان لم يترتب على العمل به مفسدة تحليل ولا تحريم ولا ضياع حق للغير). وقال ايضا في تطهير الجنان: (قلت الذي اطبق عليه ائمتنا الفقهاء والاصوليين والحفاظ ان الحديث الضعيف حجة في المناقب كما انه باجماع من يعتد به حجة في فضائل الاعمال واذا ثبت انه حجة في ذلك لم تبق شبهة لمعاند و مطعن لحاسد بل وجب على كل من فيه اهلية ان يقر هذا الحق في نصابه).

ولبعض اهل الحديث في ذلك جواز قال الخطيب البغدادي في الكفاية في علم الرواية: (باب التشدد في احاديث الاحكام والتجوز في فضائل الاعمال، ثم روى باسناده عن احمد بن حنبل قال: اذا روينا عن رسول الله (ﷺ) في الحلال والحرام والسنن والاحكام تشددنا في الاسانيد واذا روينا عن النبي (ﷺ) في فضائل الاعمال وما لايضع حكما ولا يرفعه تساهلنا فى الاسانيد).

وبمثله قال ابن عيينة والسفيان الثوري وزكريا العنبري وابن ابي الحاتم في الجرح والتعديل والامام السخاوي في الفتح المغيث وقال فيما يكون في الترغيب والترهيب من المواعض والقصص ونحو ذالك خاصة.

وهذا التساهل والتشديد منقول عن ابن مهدي عبدالرحمن وغير واحد من الائمة كأحمد ابن حنبل وابن معين وابن المبارك والسفيانيين بحيث عقد ابو احمد بن عدي في مقدمة كامله والخطيب في كفايته لذلك بابا، وقال ابن عبدالبر: (احاديث الفضائل لا

تحتاج فيها الى من يحتج به). ولفظ ابن المهدي فيما أخرجه البيهقي في المدخل في رواية ابن العباس الدوري عن ابن اسحاق: (رجل تكتب عنه هذه الأحاديث يعني المغازي ونحوها وإذا جاء الحلال والحرام أردنا قوما هكذا وقبض أصابع يديه الأربع).

وقال العراقي في شرحه على ألفيته: (أما غير الموضوع فلا بأس في إسناده وروايته من غير بيان ضعفه إذا كان في غير الأحكام والعقائد بل في الترغيب والترهيب والمواعض والقصص وفضائل الأعمال ونحوها ممن نص على ذالك من الأئمة ابن المهدي واحمد وابن المبارك وغيرهم).

وفي رسالة أبي داؤود لأهل مكة: (وان من الأحاديث في كتاب السنن ماليس بمتصل وهو مرسل ومدلس).

وقال البيهقي في المدخل الى الدلائل: (وضرب لا يكون راويه متهما بالوضع يستعمل في الدعوات والترغيب والترهيب والتفسير والمغازي فيما لا يتعلق به حكما).

وقال اللكنوي في شرحه على مختصر الجرجاني: (ولنعلم ان ممن نص على قبول الحديث الضعيف في فضائل الأعمال احمد ابن حنبل وغيره واختاره جمع عظيم من المحدثين، وصرح ابن سيد الناس في سيرته وعلي القارئ في الحظ الأوفر وفي كتاب الموضوعات والسيوطي في مقام السندسية وفي رسالته التعظيم والمنة وفي رسالته طلوع الثريا والسخاوي في القول البديع والعراقي في ألفيته والنووي في الأذكار وفي التقريب وشراح الألفية كالسخاوي وشيخ الأسلام زكريا الأنصاري وغيرهما والحافظ ابن الحجر وابن الهمام في كتابه تحرير الأصول وفي فتح القدير وغيره ممن تقدم عليهم أو تأخر).

وقال الصاوي في حاشيته على شرح الصغير: (وأما فضائل العمال والآداب الحكمية فلا تتوقف على ذالك بل يتأنس لها بالحديث الضعيف والآثار المروية عن السلف). وفي شرح الكوكب للفتوحي قال شيخ الأسلام تقي الدين: (عن قول أحمد وقول العلماء في الحديث

الضعيف في فضائل الأعمال و مثال ذالك الترغيب والترهيب بالأسرائيليات والمنامات وكلمات السلف والعلماء ووقائع العالم ونحو ذالك).

## المطلب الثاني (العمل بالحديث الضعيف إذا لم يوجد في الباب غيره أو إذا تلقته الأمة بالقبول).

قال احمد ابن حنبل: (لا تكاد ترى ينظر في الرأي إلا وفي قلبه غل والحديث الضعيف أحب إلى من الرأي ).

نقل ابن المنذر: (أن احمد كان يحتج بعمر ابن الشعيب عن ابيه عن جده ان لم يكن في الباب غيره وعمرابن شعيب هو الذي روى حديث الأقتتال عند الجمرات في الحج ومن ثم بيعة المهدي بين الركن والمقام بعد الأقتتال عند الجمرات).

عن عمران ابن الشعيب عن ابيه عن جده قال، قال رسول الله (ﷺ): (**في ذي القعدة تحارب القبائل - أو قال تحاذب القبائل - وعلامته ينهب الحاج، فتكون ملحمة بمنى، يكثر فيها القتلى، ويسيل فيها الدماء، حتى تسيل دماؤهم على عقبة الجمرة، وحتى يهرب صاحبهم فيأتى بين الركن والمقام، فيبايع وهو كاره، يقال له: إن أبيت ضربنا عنقك، يبايعه مثل عدة أهل بدر يرضى عنهم ساكن السماء وساكن الأرض**). قال أبو يوسف: حدثني محمد بن عبد الله، عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن عبد الله بن عمرو (رضي الله عنهما)، قال: (يحج الناس معا ويعرفون معا على غير إمام، فبينما هم نزول بمنى إذ أخذهم كالكلب، فثارت القبائل بعضها على بعض، فاقتتلوا حتى تسيل العقبة دما، فيفزعون إلى خيرهم، فيأتونه وهو ملصق وجهه إلى الكعبة يبكي كأني أنظر إلى دموعه، فيقولون: هلم فلنبايعك، فيقول: ويحكم كم عهد قد نقضتموه وكم من دم قد سفكتموه، فيبايع كرها، فإن أدركتموه فبايعوه فإنه المهدي في الأرض، والمهدي في السماء)[١].

---

(١) أخرجه الحاكم ونعيم بن حماد في الفتن والداني في السنن.

ومن الاحاديث التي تلقتها الأمة باالقبول أحاديث ظهور المهدي في آخر الزمان وأنه رجل من آل بيت رسول الله (ﷺ) واسمه اسم رسول الله واسم أبيه على اسم ابيه وقد روى هذا الحديث عاصم ابن ابي النجود رواه عنه عبدالله بن مسعود، و عاصم بن ابي النجود وهو ثقة مختلف فيه، وقد اجمع اهل السنة والجماعة ان المهدي هو محمد بن عبدالله الذي يأتي في آخر الزمان فيملأ الأرض قسطا وعدلا كما ملئت ظلما وجورا.

يقول عبد العزيز ابن باز فأمر المهدي أمر معلوم والأحاديث فيه مستفيضة بل متواترة متعاضدة، وهي متواترة تواترا معنويا لكثرة طرقها واختلاف مخارجها وصحابتها ورواتها وألفاظها، فهي بحق تدل على أن هذا الشخص الموعود به أمره ثابت وخروجه حق وهو (محمد بن عبد الله العلوي الحسني) وقال والحق ان جمهور اهل العلم بل هو كالأتفاق على ثبوت امر المهدي وانه حق وانه سيخرج في آخر الزمان.

وفي كتاب عقيدة أهل السنة والأثر في المهدي المنتظر يقول عبد المحسن العباد: (فلما كان من بين امور المستقبلية التي تجري في آخر الزمان عند نزول عيسى عليه السلام من السماء خروج رجل من أهل بيت النبوة يوافق اسمه اسم رسول الله واسم ابيه اسم ابيه ويقال له المهدي يتولى إمرة المسلمين ويصلي عيسى عليه السلام خلفه وذالك لدلالة الأحاديث الكثيرة المستفيضة عن رسول الله (ﷺ) التي تلقتها الأمة بالقبول واعتقدت موجبها).

## المطلب الثالث (قاعدة في أحاديث الملاحم والفتن).

قال محمود التويجري في اتحاف الجماعة في اشراط الساعة: (وبعض الأمور التي ورد الأخبار بوقوعها لم تروى إلا من طرق ضعيفة وقد ظهر مصداق كثير منها ولا سيما في زماننا هذا وذلك مما يدل على صحتها في نفس الأمر وكفى بالواقع شاهدا لثبوتها وخروجها من مشكاة النبوة).

وقال اللكنوي في الأماني للجرجاني نقلا عن ابن عبدالبر في الأستعاب وهو يعلق على حديث قال: (وهذا حديث ضعيف الأسناد إلا أن واقعه صحيح، وإذا كان الله تعالى قد إحتج على أهل الكتاب بصفة النبي (ﷺ) في كتبهم مع أنها قد حرفت وليس لها أسانيد قال تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡۘ﴾ ، وقال تعالى: ﴿ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ﴾. فما طابق الواقع من أحاديث الملاحم والفتن حتى و إن كان سنده ضعيف فهو الحق المبين).

قال ابن أمير الصنعاني في التنوير شرح الجامع الصغير: (فإن الحق يطلق على الأقوال والعقائد والأديان والمذاهب باعتبار مطابقتها للواقع ويقابله الباطل).

وقال ابن القيم في هداية الحيارى: (ولا يزال العلم الموروث عن الأنبياء لا يعرفه إلا الآحاد من الناس أو الواحد).

**المطلب الأخير وهو الرابع (اعتراض البعض على أحاديث المهدي بسبب عدم ذكرها في الصحيحين).**

قال الشيخ عبدالمحسن العباد في عقيدة أهل السنة والأثر: (إن أحاديث الواردة في المهدي لم ترد في الصحيحين على وجه التفصيل بل جاءت مجملة وقد وردت في غيرها مفصلة لما فيهما فقد يظن ظان ان ذالك يقلل من شأنها و ذالك خطأ واضح فالصيح بل والحسن في غير الصحيحين معتمد عند اهل الحديث).

# زنجیرەی پێنجەم: بەشی یەکەم:

## ئایا محمد مەهدی لەم سەردەمە پێشکەوتووە دێت یان ئەم پێشکەوتنە نامێنێ؟؟

**یەکەم: ڕاگەیاندن و تۆڕە کۆمەلایەتیەکان.**




عن علي (رضي الله عنه) قال: (**إذا نادى مناد من السماء إن الحق في آل محمد فعند ذلك يظهر المهدي على أفواه الناس و يشربون حبه و يشربون ذكره، ولا يكون لهم ذكر غيره**)[١].

ئەگەر لە ئاسمانەوە بانگەوازێک هات و بانگی کرد کە حەق و ڕاستی لە نەوەی پێغەمبەرە (مەبەست پێی محمد مەهدیە)، لەو کاتەدا مەهدی لەسەر زاری خەڵکی دەردەکەویت و دەبێتە باس و خواسی خەڵک و وشەی سەر زاریان و هەر باسی ئەو دەکەن.

لە "زوهری"یەوە (**إذا نادى مناد من السماء ليس بإنس ولا جان بايعوا فلانا...**)[٢].

ئەگەر بانگەوازێک لە ئاسمانەوە هات و بانگی کرد کە نە مرۆڤە و نە جنۆکەیە ووتی: بەیعەت بدەن بە فلان...



**ئاماژەیە بۆ کەناڵە ئاسمانیەکان و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان!**

---

(١) رواه نعيم في الفتن.

(٢) رواه الفتن نعيم بن حماد .

عن كعب قال: (**فيتراسل أهل اليمن فيما بينهم حتى يجتمعوا كاجتماع قزع الخريف**).




خەڵکی یەمەن نامە دەنێرن بۆ یەکتری و ئاڵوگۆڕ دەکەن لەنێوان خۆیان هەتاوەکو کۆدەبنەوە وەکو کۆبوونەوەی ئەو ڕەنگانەی کە دوای باران لە ئاسمان دەردەکەون و لەسەر یەک کۆبوونەتەوە.

لە ڕیوایەتی "نعيم بن حماد"ەوە هاتووە: (**... ويراسلون أهل الشام فينصبون من حيث كانوا، إني لأعلم أسماءهم وأسماء آباءهم وأميرهم ومناخ ركابهم**).

... نامە دەنێرن بۆ خەڵکی شام لە شوێنی خۆیان ئامادەدەبن و دەکەونە سەرپێ من ناوی خۆیان و باب و باپیرو شوێنی سواریەکانیان دەزانم.

(**فيتراسل ويراسلون**) نامە دەنێرن و ئاڵوگۆڕی دەکەن. لەڕێگەی فەیسبووک یان واتس ئەپ یان تێلیگرام یان بەریدی ئەلیکترۆنی یان جگە لەمانە دەبێت. ئەگەر بیر لەم ڕۆژگارە بکەینەوە دەبینین کە دوای بڵاوبوونەوەی بابەتەکان لەسەر محمد مەهدی لە یوتیوب و فەیسبووک و هتد.... دەبینین ئێستا محمد مەهدی لەسەر زاری خەڵک زۆر بڵاوبووەتەوە و باسدەکرێت (کەناڵی ڕووداو، فەلەکناس، لە کۆبوونوە لە ئەمریکا، هتد... باسی لێوەکراوە). جا تەصەوڕبکە ئەگەر هاتوو دەربکەوێت تۆ بڵێی چۆن دەنگ بداتەوە.

## دووەم: هۆکاری گەیاندنی سەردەم (ئۆتومبێل و فڕۆکە و شەمەندەفەر)!

لە ئیمام "باقر" ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: (منهم من يفقد عن فراشه ليلا فيصبح بمكة ومنهم من يرى يسير في السحاب نهارا، يعرف باسمه واسم ابيه وحليته ونسبه، قلت: جعلت فداك أيهم أعظم أيمانا؟ قال: الذي يسير في السحاب نهارا).

کەسی وا هەیە شەو هەڵدەستێت و لەجێگای خۆی نامێنێت لە مەککە بەیانی دەکاتەوە، وە هی وا هەیە لەو ڕۆژدا دەبینرێت لە لەناو هەورەکان دەڕوات! بە ناوی خۆی و باوکی و بە سیفاتی و ڕەچەڵەکی دەناسرێتەوە. (ڕاوی دەڵێت ) پێم گوت: بە فیدات بم! کامیان گەورەترن یاخوود پێشکەوتووترن؟ ووتی: ئەوەی بە ناو هەورەکاندا دەڕوات بە ڕۆژ.





**شەرحی ئەثەرەکە:**

(**بەناو هەورەکاندا دەڕوات**): دەفرێت بەفڕۆکەی مەدەنی.

(**دەناسرێتەوە بە ناوی خۆی و باوکی**): لە ڕێگەی جەوازی سەفەر.

(**حلیتە-سیفاتی**): سیفاتی کەسێتی لەڕێگەی وێنەی شەخسی کەوا لەسەر جەواز سەفەر هەیە.

(**ڕەچەڵەکی**): شوێنی نیشتەجێبوون یان لەدایکبوونی بنەماڵەکەی یاخوود (کونییەی شەخصی).

ئیمامی "بەرزەنجی حوسەینی" وەفاتی کردووە لە ساڵی (١١٠٣) کۆچی کە دەکاتە پێش (٣٣٦ ساڵ) لە کیتابی (الاشاعة في اشراط الساعة)دا ڕیوایەتی کردووە: حەوت پیاوی زانا لە شوێنە جیاجیاکانەوە دێن بە بێ ئیتیفاق. هەر یەک لەو حەوتە، سێ سەد و چەند پیاوێک بەیعەتیان پێداوە لە مەککە کۆدەبنەوە هەندێک بەهەندێکیان دەڵێن: چی شتێک ئێوەی هێناوە بۆ ئێرە (مەککە)؟ دەڵێن: هاتووین بۆ گەڕان بەدوای ئەو پیاوەی کەوا دەبێت لەسەر دەستی ئەو فیتنەکان ئارام ببێتەوە و (قسطنطینیة) -ئەستەمبوڵی ئێستا دەکات- فەتح بکات. ئێمە ناسیومانە بە ناوی خۆی و باوکی و دایکی. هەر حەوتیان کۆدەبنەوە لەسەر ئەوە و بە دوایدا دەگەڕێن، لە مەککە دەیدۆزنەوە و پێی دەڵێن: تۆ فلانی کوڕی فلانی؟ ئەویش دەڵێت: نەخێر، بەڵکو من پیاوێکم لە (ئەنصار) پشتیوانان و لەدەستیان دەردەچێت و ئەوانیش وەسفی ئەم پیاوە بۆ ئەهلی خیبرە و ئەوانەی کە زانیاریان لەسەری هەیە باسدەکەن. ئەوانیش دەڵێن: ئەوە ئەو هاوڕێیەتانە کە بەدوایدا دەگەڕێن و ڕۆیشت بۆ

مەدینە. ئەوانیش بەدوایدا دەڕۆن بۆ مەدینە، لەوێ دیسان بۆ مەککە لێیان ڕادەکات کە سێ جاران بەمشێوەیە دێت و دەڕوات!

ئیمامی بەرزنجی دەڵێت: هاتووچۆیان بۆ مەدینە دووجار یان سێ جار لە (٢٣) ڕۆژ یان (٢٥) ڕۆژدا هیچ کێشەی تێدا نییە! تاوەکو بڵێین هەموویان دۆستانی (اولیاء)ی خوان! دەکرێت و دەگونجێت زەوی بۆیان وێکبێتەوە (بێتەوە یەک)، یان دەکرێت خاوەن هەنگاوبن، واتا هەنگاویان زۆر ببرێت!

## تەعلیق لەسەری:

بەوشێوەیە سێ جار چوون و هاتن لە نێوان مەککە و مەدینە کە دەکاتە شەش جار، لە پێنج ڕۆژ چوون و هاتن. شەش جار جاران دەکەین و لێکدەدەین لە ٥ ڕۆژ دەکاتە ٣٠ ڕۆژ. ئەوەش مەحاڵ بووە لە کات و زەمەنی ئیمام بەرزەنجی بۆیە دەڵێت ئەوانە ئەولیا بوونە.

(**زەوی وێک دێتەوە بۆیان**): مەسافەکان کورت دەبنەوە بۆیان. نێوان مەککە و مەدینە ٤٥٤ کم کورتکراوەتەوە بۆ نیوە، واتا (٢٢٧) کم.

(**خاوەن هەنگاو-شەقاو**): واتا هەر شەقاوێکیان ١ کم بووە وەکو کەرامەتێک بۆیان!

## تەعلیق لەسەر ئەثەرەکە:



ئیمامی "بەرزەنجی" پێشکەوتنی سەردەمی ئێمەی نەبینیووە، بۆیە وای گوتووە. ئەگەر لەم سەردەمە بوایە ڕوودانی کارەکەی زۆر لەلا ئاسایی بوو، چونکە ئەمڕۆ گەشتکردن لەنێوان مەککە و مەدینە بە شەمەندەفەری خێرا سەعات و نیوێکی دەوێت بۆ چوون و هاتن! کەواتە لە ڕۆژێکدا دەتوانی هەشت جار بێیت و بچیت! نەوەک (٣٠) ڕۆژی بوویت وەکو سەردەمی کۆن.

بۆیە هۆکاری شەرحەکەی شێخ بەرزەنجی لەبەر ئەوە بووە، پێشبینی ئەو پێشکەوتنەی نەکردووە لە هۆکارەکانی گەیاندن و ڕێگاو بان. موسڵمان دەبێت ئاوایی بێت، نەوەک کە عەقڵی قبوڵی نەکات بڵێت درۆیە و حەدیس وەرناگرین و تەنها قورئان بەسە. هەروەک ئێستا هەندێک خۆیان لە حەدیسی پێغەمبەر (ﷺ) بەریئکردووە (وهم يحسبون أنهم يحسنون صنعا).

# زنجیرەی پێنجەم: بەشی دووەم:

## چەکە پێشکەوتووەکان لە جەنگە گەورەکەی محمدی مەهدی.

ئیمامی "عبدالرزاق" لە (مصنف)ـەکەی خۆیدا ڕیوایەتی کردووە: (**ويل للعرب من شر قد اقترب، الأجنحة وما الأجنحة الويل الطويل في الأجنحة ريح فيها هبوبها ....**).

واتا وەیل و بەهیلاکچوون بۆ عەرەب لە شەڕێک کەوا نزیکبووەتەوە، باڵەکان! دەزانی باڵەکان و دەزانی باڵەکان یەعنی چی؟! نەهامەتی و سزایەکی زۆر و درێژ لەو باڵانەدا هەیە بایەکی بەهێز تێیدا هەڵدەکات ....).

**پرسیار/ ئەو باڵانە چین کەوا وەکو با هەڵکردن هەڵدەکات، ئایا فڕۆکە نییە؟!**

"نعیم ی کوری حەماد" لە کتێبی (الفتن)دا ڕیوایەتی کردووە: **(لولا أن أشهد الملحمة العظمى فإن الله تعالى يحرم على كل حديدة أن تجبن، فلو ضرب الرجل يومئذ بسفود لقطع).**

واتا ئەگەر دەهاتو جەنگە گەورەکەم دەبینی کە خوا لەو ڕۆژەدا حەرامی دەکات لەسەر هەموو ئاسنێک کەوا ترسنۆک بێت، ئەگەر پیاوێک بە ئاسنی بچووک (سفود) لە شتێک بدات دەیبڕێت.



**(السفود):** ئاسنێکی بچووکە سەری باریک بووەتەوە، ئایە ئەوە وەصفی فیشەک و گولە نییە؟!

"نعیم" لە کتێبی (الفتن) لە "کعب" ڕیوایەتی کردووە: **(وطيرا تضرب وجوههم بأجنحتها فتفقع أعينهم وتصدع فيهم الأرض فيتجلل في مهوى بعد صواعق ورواجف تصيبهم...).**

واتا باڵندەیەک بەباڵەکانی لە دەم و چاویان دەدات، چاویان کوێر دەکات و زەوی لە ژێریان شەق دەبێت. تێیدا دەچنە خوارێ، دوای تریشقە و دەنگی بەهێز و زەوی هەژان کە توشیان دەبێت بەهۆی ئەم باڵندانەوە....



**ئایە ئەمانە بەڵگە نییە لەسەر فڕۆکە؟!**

لێدانیش بە باڵ بەڵگە نییە لەسەر ساروخ کاتێک لە باڵەکانی دەردەچێت و چاو کوێر دەکات بەهۆی ئەو پارچانەی (شظایە) لێوە دەردەچێت لەکاتی تەقینەوەیدا؟!



(**دەنگە بەهێزەکان-الصواعق**): ئایە دەنگی ئەو فڕۆکانە نییە، ئەوانەی کاتێک قەصف دەکات لەگەڵ دەنگی، گوێ کەڕ دەکات.

(**هەژان و لەرزین و شەق بوونی زەوی**): ئایە ئەوە تەقاندنەوەی قونبولەکان نییە کاتێک بەری دەداتەوە؟! کاتێک زەوی و ئەوەی لەسەریەتی دەلەرزێت بەهۆی ئەم چەکانەوە!

هەروەها ڕیوایەتی کردووە (**فلو ضرب مؤمن یومئذ بوتد لقطع**).

واتا لەو ڕۆژەدا ئەگەر ئیماندارێک بە سنگ لە شتێک بدات دەیبڕێت! ئایا ئاماژە نییە بۆ قازیفە و هاوەنەکان کە شێوەیان وەک سنگ وایە بەتەواوی.

هەروەها هاتووە: (**یخرج السفياني وبيده ثلاث قصبات ،لا يقرع بهن احدا إلا مات**).

واتا سوفیانی لەقەبە بۆ کەسێکی زاڵم کە چەند کەسێکن سوفیانی میسڕ، سوفیانی شام... دەردەچێت سێ قەصەبە وەک قامیشی بەدەستەوەیە، بەهۆیەوە لەهەرکەسێک بدات دەیکوژێت.

(**قامیش-القصبة**): بریتییە لە شتێکی لولەیی ناوەوەی بۆشە یاخود بە تاڵە!

(**القرع**): واتا لێدان نەیوتووە (یضرب) واتا پێدادان.





**بیربکەوە ئایە ئەم سیفەتە لە دەمانچە و کلاشینکۆفدا نییە؟!**

هەروەها ڕیوایەتی کردووە: **(ثلاث نيران نار من زفت ونار من كبريت ونار من نفط، ولأتركنك جلحاء قرعاء لا يحول بينك وبين السماء شيء وليبلغن صوتك ودخانك أنافي السماء).**

سێ ئاگر، ئاگرێک لە زفت و ئاگریک لە کبریت و ئاگریکیش لە نەفت، کە بە هۆیانەوە مرۆڤ ئەوەندە پێیانەوەبێت سەروبەر دەبێت، کە پرچی بەهۆیەوە بسوتێت و سەری ڕووت دەکات وەک ئاژەڵێکی شاخدار شاخی بشکێنیت. کە هیچ شتێک نابێتە پەرژین لەنێوان تۆ و ئاسمان کە دووکەڵ و هاوارت بەرزدەبێتەوە بۆ ئەوپەڕی ئاسمان.

**ئایە ئەوە بەڵگە نییە لەسەر ئەو تەقینەوەی بەهێزانەی کە دروستکراون لە زفت و کبریت و نەفت ؟! مەگەر چەکی ناوەکی یان چەکی نەووی یان ناپاڵم یان جگە لەمانەش بێت! جا بیربکەوە!**





خۆزگە دەخوازم زانا و مامۆستاکان کە وشەی وا هەیە لەوان دەپرسم تا بیکەنە کوردی بۆم، ئەوان باس لەم بابەتانە بکەن و ڕێخۆشکەربن بۆ محمدی مەهدی.

بۆیە ئەو زانیارییانەم بۆتان هێناوە تاکو ئەو گومانەی لاتانە نەمێنێت و دڵنیایی جێگای بگرێتەوە کەوا مەهدی علیه السلام لە کات و ساتی ئێمەدا دەردەکەوێت. والله أعلى و أعلم.

# زنجیرەی پێنجەم: بەشی سێیەم:

## نەوت لەسەردەمی محمدی مەهدی لە صحيحي "موسلم"دا !

ئیمامی "موسلیم" ڕیوایەتی کردووە لە صەحیحەکەیدا لە ئەبوهورەیرەوە (﵁)، گوتوویەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (تَقِيءُ الْأَرْضُ أَفْلَاذَ كَبِدِهَا، أَمْثَالَ الْأُسْطُوَانِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، فَيَجِيءُ الْقَاتِلُ فَيَقُولُ: فِي هَذَا قَتَلْتُ، وَيَجِيءُ الْقَاطِعُ فَيَقُولُ: فِي هَذَا قَطَعْتُ رَحِمِي، وَيَجِيءُ السَّارِقُ فَيَقُولُ: فِي هَذَا قُطِعَتْ يَدِي، ثُمَّ يَدَعُونَهُ فَلَا يَأْخُذُونَ مِنْهُ شَيْئًا).

### التعليق:



زەوی وەک بڵێیت دەڕشێتەوە و باشترین شتی لەناو خۆی دەردەکات هاوشێوەی (اسطوانه - عه مود، وەک بەرمیل) لەزێڕ و زیو! کەسی بکوژ (قاتل) دێت و دەڵێت: بۆ ئەوەبوو کوشتم. کابرای کەوا سیلەی ڕەحمی پچڕاندبوو دێت و دەڵێت: بۆ ئەوەبوو پەیوەندی خزمایەتیم پچڕاند. کەسی دز دێت و دەڵێت: بۆ ئەوەبوو دەستم بڕدرا، پاشان بەجێی دەهێڵن)[١].

## شیکردنەوە:

**(التقيء)**: واتە دەرهاویشتن و هێنانەوە.

**(أفلاذ كبدها)**: پارچە جەرگ بۆ شتی بەنرخ دێت. هەروەها "ابن سكيت" لە شەرحی ئەم حەدیثە دەڵێت: (فلذ) پارچەیەکە لە جەرگی ووشتر(جمل) کە لە نەفتی خام دەچێت!




**(اسطوان)**: بەرمیل، نەوت و پێکهاتەکانی نەوت دەکرێنە ناو بەرمیل پاش دەرخستنی.

**(أمثال الأسطوان من الذهب والفضة)**: بەڵگەیە لەسەر بەنرخی ئەو شتەی کە بەدەردەکەوێت، بۆیە فەرموویەتی (أمثال)بوو، پێچواندن وەک ئاشکرایە نەوت پێی دەڵێن (زێڕی ڕەش) لەبەر بەنرخیەکەی لە نێوان وڵاتان. والله أعلى وأعلم.

---

(١) رواه مسلم

زنجیرەی شەشەم:

# بنەماڵەی ئال سعود.

"نوعەیم بن حەماد" کە (مامۆستای بوخاریە) لە کتێبی (الفتن)دا ڕیوایەتێک دەربارەی بنەماڵەی (ئال سعود) دەگێڕێتەوە لە "کعب"وە: (يلي المهدي فيظهر عدله، ثم يموت ثم يلي بعده من إهل بيته من يعدل، ثم يلي منهم من يجور ويسيء، حتى ينتهي إلى رجل منهم فيجلي اليمن إلى اليمن، ثم يسيرون إليه فيقاتلونه ويولون عليهم رجلا من قريش يقال له محمد على يد ذلك اليماني تكون الملاحم).

واتا مەهدی (لێرە مەبەست پێی کەسێکی عادل دێت) عەدالەتەکەی بەدەردەکەوێت پاشان دەمرێت، پاشان لە بنەماڵەکەی ئەو کەسێکی تر حوکم دەکات بە عەدالەت، پاشان کەسێکی تر هەر لەوان حوکم دەکات و زوڵم دەکات. بەمشێوەیە حوکم لەناو ئەو بنەماڵەیە بەردەوام دەبێت، تاوەکو دەگات بە کەسێک لەوان کە یەمەنیەکان لە سعودیە دەردەکات بۆ یەمەن. پاشان شەڕ ڕوودەدات لەنێوان ئەوان و یەمەنییەکان کە لەکۆتاییدا کەسێک لە یەمەنیەکان دەبێت بە خەلیفە لەسەر ئەو بنەماڵەیە و، شوێنی حوکم کردنیان و لەسەر دەستی ئەو کەسە جەنگە گەورەکە ڕوودەدات.

## شیکردنەوە:

بنەماڵەیەک دەسەڵات دەگرنە دەست کەسی یەکەم حوکمیان دەکات کەسێکی عادلە و لەقەبی مەهدی بۆ دادەنرێت لەبەر عەدالەتەکەی. یەکەم کەس لە بنەماڵەی (ئال سعود) ناوی "عبدالعزیز بن محمد بن سعود" (نەک عبدالعزیز بن عبدالرحمن)، کەسێکی زور عادل بوو، هەربۆیە هەندێک لە زاناکان لەقەبی مەهدی سەردەمی خۆیان پێدا لەوانەش


وێنەی شا فەهد

(ابن جناد). کەسی دووەمیش عەدالەت دەکات و، کەسی سێیەم زوڵم دەکات. تاحوکمەکە دەگات بە کەسێک هەر لەو بنەماڵەیە کە یەمەنیەکان (تەرحیل) دەردەکات لە سعودیادا، کە ئەمەش لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٩) و بیدایەتی (١٩٩٠) بوو. لەسەر دەستی "مەلیک فەهد" و پاشان شەڕ لەنێوان یەمەن و سعودیەکان ڕوودەدات، کە لە سەرەتای هاتنە سەر حوکمی مەلک "سەلمان" ڕوویدا تا ئێستاش هەر بەردەوامە کە زۆری نەماوە إن شاء الله خەلیفەی (یەمانی) کە "مەهدی" لە قوڕەیشیەکانە. بەڵام لە یەمەن ژیانی بەسەر بردووە و عائیلەکەیان لە شوێنێک ژیاون لە یەمەن پێی دەگوترێت "کەرعە". کۆتایی بە دەسەڵاتی ئەم زاڵمانە دەهێنێت و جەنگە گەورەکە بەرپا دەکات لەگەل کافران. والله اعلم.


وێنەی شا سەلمان

# زنجیرەی حەوتەم:

## ٣٥ سیفەتی محمد مەهدی هەروەک بڵێیت بە چاوی خەیاڵ دەیبینیت.

١. ناوی "محمد"ە.

٢. لەقەبی "أبوعبدالله" و "أبوالقاسم"ە.

٣. ناوی باوکی "عبدالله"یە.

٤. ناوی دایکی "ئامینە"یە.

٥. دوو ناوی هەیە یەکیان شاراوەیە، یەکیان ئاشکرایە.

٦. قوڕەیشی و هاشمی یە.

٧. لە ئالوبەیتی پێغەمبەرە (ﷺ) لە نەوەی ئیمام (حسن)ـە کوڕی کچی پیغەمبەرە (ﷺ).

٨. لەدایکەوە دەگاتەوە بە ئیمام حسێن و لە باپیشەوە دەگات بە ئیمام حسن.

٩. یەمانیە (ئەصڵی نیشەجێی بوونی یەمەنە).

١٠. لە حیجاز گەورە دەبێت.

١١. لەگەڵ یەمەنییەکان دەردەکرێت بۆ یەمەن (تەڕحیل) دەکرێت. هەروەک پێشتر لە زنجیرەی شەشەم باسی تەڕحیلی یەمەنییەکانم کرد لەساڵی (١٩٩٠)، واتا ئێستا لە ژیانەدایە.

١٢. لەشوێنێک لە یەمەن دەردەکەوێت پێی دەگوترێت "کرعة".

١٣. ڕەوشتی وەک ڕەوشتی پێغەمبەرە (ﷺ) بەڵام شێوەی جیاوازە.

## شکڵ و شێوەی:

١٤. ڕەنگی عەرەبیە، واتا (ئەسمەرە و سوورایەتییەکی تێدایە).

١٥. کەچەڵە (هەندەێک پرچ لە پێشینەی سەری هەیە و بەڵام ئەصڵەح نییە)، واتا سەر ڕووت نییە.

١٦. نێوچەوانی پان دیارە واتا بڵندە وەک هی شێر وایە کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (أجبه) کە ئەمەش یەکێکە لە ناوەکانی شێر.

١٧. پرچی ڕەشە، لوولە و درێژە دەگاتە سەر شانی.

١٨. دەموچاوی جوان و گەشاوەیە و نوری پێوەدیارە.

١٩. لەسەر دەموچاوی هەندێک نیشانە دیارن.

٢٠. خاڵێک لەسەر ڕوومەتی ڕاستی هەیە.

٢١. برۆیەکانی قەوس و درێژن و لە ناوەڕاست نەگەیشتوون بەیەکەوە.

٢٢. چاوی گەورە و جوانن و بۆ ناوەوەن و چاوەکانی ڕەشن.

٢٣.لووتی لە ناوەڕاستەوە قەوسێکی تێدایە نزمایەکی بەدوایدا دێت.

٢٤.ددانەکانی پێشەوەی ڕونەقیان تێدایە و لەسەرەوە و خوارەوە بۆشاییی لەنێوان ددانەکانی پێشەوەی هەن و بۆشاییەکەش کەم نییە.

٢٥.زمانی گرانیەکی تێدایە هەمووکەس پێی نازانێت. بەڵام کاتێک وشەیەک لەسەر زمانی گران دەبێت بەدەستی ڕاستی لەڕانی چەپی دەدات.

٢٦.ڕیشی پڕە.

٢٧.جسمی (قیافەی) ئیسرائیلییە (توندوتۆڵە و ڕێکوپێکە)، نە کورتە و نە درێژ و نە قەڵەوە و نە زەعیف.

٢٨.ملی ئەستورە و کورتە.

٢٩.نێوان هەردووشانی پان و بەرینە.

٣٠.سینگی کراوەیە و پانە و بەرینە زگیشی پانە.

٣١.هەردوو ڕانی ئەستوورن و لێک دوورن، واتا لەکاتی ڕۆیشتنی بەیەکەوە نووساو نین.

٣٢.دوونیشانەی زگماکی (مۆر) هەیە یەکێکیان لەنێوان هەردوو شانی بۆلای خوارشانی چەپی، هەروەک هی پێغەمبەر (ﷺ).

٣٣.تەمەنی لەنێوان (٣٠) بۆ (٤٠) ساڵە کاتێک دەردەکەوێت.

٣٤.کاتێک خوطبە بخوێنێت دەنگێکی پڕی هەیە.

٣٥.عەمامەیەکی سپی لەسەرە بەلای ڕوومەتێکی شۆڕدەبێتەوە و بەلا ڕوومەتەکەی تری سەردەکەوێتەوە سەری.

جلەکانیشی سپییە. بەڵگەکان حەدیس و ئەثەرن لەبارەی سیفەتەکانی.

## ناوبڕ: دوور لەبابەت.

موسڵمانە خۆشەویستەکان! پێش ماوەیەک پۆستێکم کرد کەوا حەملەکەی ئیسلام داخڵی مانگی نۆیەم بوو. هەروەها هەر حەملێک بێگومان لەکۆتاییەکانی ژانی زیاتر دەبێت. ئەوەی لەم چەند ڕۆژەدا کەوا ڕوودەدات لە میسر و قودس و ئیسڕائیل شتێکی ئاسایی نییە. هەربۆیە لە قودس لە (٦)ی مانگەوە لە نەخۆشخانەکان حاڵەتی طەواری ڕاگەیەندرا و، دکتۆرەکان بەشێوەیەک نەتوانن ئیجازە وەربگرن لە بەشەکانی طەواری. لە ئیسرائیل هێزی بەرگری ناوەخۆیی باری نائارامی ڕاگەیاند لە بەشی باکوور و، داوای لە هاوڵاتیان کرد کە بۆ خۆیان ئاو و خواردن و پاتری شەحنی کارەبایی خەزن بکەن و هەروەها دکتۆرەکان لە ئامادە باشیدابن. بۆیە چاوەڕێی شتی غەریب تر بکەن، والله اعلم.

هەروەها دەڵێم، ئایا تۆ بڵێیت کاتی ئەوە هاتبێت کەسێکی تر بێتە ناو سیناریۆکە کە خەڵکی زۆر بەهۆیەوە گومڕابن و خۆیان لەگەڵی بەکوشتن بدەن و واپیشان بدات کە ڕزگارکەری ئەم ئومەتەیە کە دوای (٩) مانگ لە ناو دەچیت؟! ئایا تۆ بڵێیت بینای هەیکەل کاتی دەست پێکردنی و بۆ کۆتایی هاتنی تا مانگی (٤) نەبێت؟! ئایا تۆ بڵێیت کاتی دەرکەوتنی ڕایەی یەمانی بکەوێتە مانگی (٤) ؟! ئایا تۆ بڵێیت کاتی وێرانبوونی میسر لە کوتاییەکانی نەبێت؟! ئایا تۆ بڵێیت قیسمەتی ئێمە بێت کە بگەین بەو کاتەی (العجب کل العجب بین جمادي ورجب)، واتا هەموو سەرسوڕمانییەک لەنێوان مانگی جمادی و ڕەجەب کە ئێستا (جمادی ١) پاشان (جمادی ٢) و پاشان ڕەجەب؟!

نامەوێت زیاتر باسبکەم، بەڵام کاتی ئەوەهات کە واقع بۆخۆی قسە بکات، ئەو کات کەس ناتوانێت ئینکاری بکات. مەگەر کەسێک تازە لەخەو هەڵبستێت و، خەو چاوی بەر

نەدابێت و نەزانێت گەشتی ئۆممەت بە کوێ گەیشتووە لەسەر نەخشەی ڕێگا! ڕۆژگار بە حەمل کەوتووە لە ڕووداو.

زنجیرەی هەشتەم:

## دەرکەوتنی محمد مەهدی لە دوای منصور اليماني.

بەپێی ڕیوایەتەکان لە حەدیس و ئەثەرەکان، خەڵکی یەمەن خیلاف لەنێوانیان دروست دەبێت کەسێک دەکەن بە سەرۆک لەسەر خۆیان ناوی "منصور"ـە. پاشان شەڕێک لەنێوانیان ڕوودەدات وەک شەڕی سەردەمی جاهیلی یەکەم.

پاشان محمد مەهدی دەردەکەوێت، هەروەک لەم قەولەی "عبدالله بن عمر" زیاتر ڕووندەبێتەوە، (بعد المهدي، الذي يخرِج أهل اليمن الى يمن ، ثم المنصور، ثم المهدي).

واتا لەدوای مەهدی، مەبەست پێی "عبدالعزیز بن محمد بن سعود"ـە، هەروەک لە زنجیرەی شەشەم باسم کردووە. کەسێک دێت کە یەمەنیەکان تەڕحیل دەکات بۆ یەمەن. ئەمەش لە ساڵی (١٩٩٠) بوو لە زنجیرەی شەشەم باسکراوە. پاشان دەرکەوتنی سەرۆکێکە بە ناوی "منصور" لە یەمەن، ئنجا محمدی مەهدی یە.

وێنەی عبد ربه منصور هادی



ئەوەی کە لە واقع بینیمان لە (٢٠١٢/١/٢٠) لەدوای لادانی "علی عبدالله صالْح" خەڵکی یەمەن کەسێکیان هەڵبژارد کە ناوی "عبد ربه منصور هادی" بوو. سبحان الله دوای هەڵبژاردنی ئەم کەسە شەڕی قەبائیل و جەیش و حوثییەکان دەستی پێکرد، هەروەک سەردەمی جاهیلی، تەنانەت ئێستا لای بەتەمەنەکانی یەمەن وەک پەندێک دەڵێن: (من هادینا لمهدینا). واتا لە منصور هادي یەوە بۆ مەهدی. إن شاءالله ئیمام بەڕێوەیە، والله أعلم.

# ناوبڕ

وەڵامی گومانێک کە لەلای هەندێک برادەرەوە دروست بوو بوو، کە گوایە سەر بە شیعەیە ئەو شتانەی بڵاوی دەکەینەوە. بۆ ئەوانەی کە لە نزیکەوە نامان ناسن و گومانیان بۆ دروست بووە لەوەی کە شتەکانمان هی شیعەبێت. ئەوە دەڵێم: ئەوەی زنجیرەی شەش و هەشتی خووێندبێتەوە، دەبێت ئەو شتەی بۆ ڕوونبێتەوە کە باسی ئەوەم کردووە کەسێک کە لەقەبی مەهدی پێی دراوە پێش هاتنی مەهدی لە حەدیث و ئەثەرەکان ئەو کەسە "عبدالعزیز بن محمد بن سعوود"ـە کە کەسی یەکەمە لە بنەماڵەی ئال سعود کە موڵکی بۆیان دامەزراندبێت کە کەسێکی عادل و بەتەقوا بوو. هەر بۆیە لە زاناکانی سەردەمی خۆی بە مەهدی سەردەمی خۆی ناویان دەبرد. کە کچی "محمد بن عبدالوهاب"ی لەلای بوو (زاوای بوو). هەروەها دەسەڵاتەکەی لەسەر قورئان و حەدیث بوو. هیوادارم لێتان تێکەڵ نەبووبێت لەگەڵ "عبدالعزیز بن عبدالرحمن آل سعود".

دەزانم لەوانەیە ئەم قسەیە بەدڵی هەندێک کەس نەبێت. بەڵام ئێمە قسە ناکەین بۆ ڕازیبوونی خەڵک، بەڵکو هەقەکە وەک خۆی دەگەیەنین. هەرچەندە لەهەمان کاتدا هەندێک ڕیوایەت لە مەزهەبی شیعەکان هاتووە کەوا پاڵپشتە بۆ ڕیوایەتکانی خۆمان کە

لەوانەیە ڕوونکردنەوەبێت بۆئەوەی لای ئێمە. کە ئەمەش ووتنی لای هەندێک کەس بەهەمان شێوە لەوانەیە دڵگرانیەک دروست بکات. بەڵام دەبێت بزانین کەوا مەهدییەکەی ئێمە "محمد بن عبدالله"یە و، ئەوەی ئەوان "محمد بن حسن العسکری" یە. ئەوەی ئێمە ڕایکردووە لە دەست دەسەڵاتی سعودیە، ئەوەی ئەوان لە ژێر زەمینە "سرداب"ـە لە سامڕاء.

جا تۆ بڵێی شیعەکان کەسی یەکەم لە بنەماڵەی ال سعود بە مەهدی ناو ببەن لەکاتێکدا کە زاوای محمدی کوڕی عبدالوهابیش بێت! زنجیرەی شەش بەتەواوی بخوێنەوە گومانەکە دەڕەوێتەوە. والله أعلی أعلم.

### زنجیرەی نۆیەم:

## حاڵی محمد مەهدی علیه السلام پێش دەرکەوتنی.

"محمد مەهدی" لەلایەن دەسەڵاتدارانی سعودیە (حجاز) لەسەر گومانێکی زۆر کە پێیان وایە مەهدییە. هێزێکی بۆ دەنێرن بۆ دەستگیرکردنی، چونکە نایانەوێت ئیسلام سەربکەوێت، خوا لەناویان ببات. ئەو کات محمد مەهدی لەگەڵ هاوڕێکەی کە ناوی "منصوڕ"ـە ڕادەکەن لە دەستیان. ئنجا دەسەڵاتی سعودیە ئەوەندەی لە توانایدایە و دەستی پێدەگات لە عائیلەکەی محمد مەهدی دەستگیریان دەکات لە گەورە و بچووک، منداڵی بچووک بەڵێ مندالی بچووک! ئەمەیە دوژمنداری بۆ ئیسلام و ئەهلەکەی. لە پاشان هاوڕێکەی ئیامی مەهدیش "منصور"[١] دەستگیردەکرێت و دەکوژرێت. ئیمام لەسەر سوننەتی موسی علیه السلام (خائفا یترقب)، بە ترس و چاوگێڕان ڕادەکات و ژیانی بەمشێوەیە بەردەوام دەبێت تا ئەوکاتەی لەنێوان ڕوکن و مەقام بەیعەتی پێ دەدرێت.[٢]

---

(١) تێبینی: ئەم "منصوڕ"ـە جیایە لەگەڵ "منصوڕ"ی زنجیرەی پێشتر کە دەبێتە سەرۆکی یەمەن.

(٢) لە کتێبی (الفتن)ی ڕاوی زوڵم لێکراو "نعیم بن حماد".

هەروەک بڵێیت کە لەدوای ئەم ڕووداوە ئەم کەسە دەنگ و باسی بڵاو دەبێتەوە لەناو موسڵمانان، هەروەک قەولێک لە "ئیمام علی"یەوە ڕیوایەتکراوە لەلایەن شیعەکانەوە کە دەفەرمووێت: (یظهر في شبهة لیستبین ، فیعلو ذکره، و یظهر أمره). واتە بەگۆمانێکەوە دەردەکەوێت بۆ ئەوەی دیاربێت، ئنجا ناوی دەنگدەداتەوە و حەقیقەتەکەی بەدەردەکەوێت. والله أعلم.

# ناوبڕ:

الله أكبر خەونێکی دڵخۆشکەر. موسڵمانێك خەونێکی بەمشێوەیەی بینیووە، کە مانگ تەواو بووە و لەسەری نووسراوە "وفار التنور" واتا تەنوەری ئاگر پڕ بوو لە ئاو.

بێ گومان مانگ ئاماژەیە بۆ کەسێکی گەورە و پڕبوونی تەنوورە لە ئاو. خوای گەورە کردی بە ئاماژە بۆ نووح علیه السلام بۆ ڕزگار بوونی دوای ناخۆشییێکی زۆر و طۆفانێک کە هەموو جیهانی دەگرێتەوە.

**ئایا تۆ بلێیت وەلیمەی خوای گەورە نزیکبووبێتەوە و دەرکەوتنی مەهدی بەدوا دابێت؟!**

باکور

ڕۆم
(ئەمەریکا)

خۆرئاوا

خۆرهەڵات

ڕوسیا

باشور

تورکیا

سعودیا

LOADING

CONNECTED

مەیدانی جەنگ خاکی شام (سوریا).




جەنگێک کە چاوەڕێ دەکرێت ڕوودات لە ناوچەی "قەرقیسیا" کە دەکاتە "بصرية" کە شارێکی بچووکە لە نزیک "دێرلزوور" لەبەری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فوڕات لەلای زێی خابوورەوە شەڕێکی گەورە هەڵدەگیرسێت. شەڕەکە لەنێوان سوفیانی و ڕۆم (ئەمەریکا) و تورک و (إخوان الترك) واتە ڕوسیا و تورکیا و هەروەها سعودیا و (مارقة الترك) کوردەکان دەکات والله تعالى اعلم بەشداری ئەم شەڕە دەکەن. ئەم شەڕە کوشتارێکی گەورەی لێ دەکەوێتەوە و سوفیانی لەم جەنگە سەردەکەوێت و براوە دەبێت.



زنجیرەی دەیەم

# جەنگی قەرقیسیا.

ئەوەی لە سوریا چاوەڕوان دەکرێت پێش هاتنی ئیمام مەهدی بەماوەیەکی کەم ئەوەی ئێستا ڕوودەدات لە سوریا پێشەکیە بو ئەم باسەی کە دەیکەم. زورجار باس لەوە کراوە چیایەکی زێڕین لە شوێنی ڕوباری فوڕات دەردەکەوێت و خەڵک لەسەری بەشەڕدەچن لەهەر (١٠٠) کەس (٩٩)ی دەکوژرێت کە ئەمەش حەدیسێکی سەحیحە.

**بەڵام ئایا چۆن و لە چی شوێنێک؟!**

والله اعلم ئەم ڕووداوە لە "قەرقیسیا" کە دەکاتە "بصيريه" کە شارێکی بچووکە دەکەوێتە نزیک "ديرالزور" لە سوریا، لەو شوێنەی کە ئاوی خابور دەچێتە ناو ڕووباری فوڕات ئا لەم شوێنە، والله اعلم شەڕێکی زور گەورە ڕوودەدات لەنێوان جەیشی سوفیانی و جەیشی ڕۆم کە دەکاتە ئەمریکا و جەیشی تورکەوە (إخوان الترك) کە دەکاتە ڕوسیا و تورکیا، هەروەها جەیشی سعودی یان خەلیجیەوە (مارقة الترك) کە دەکاتە کوردی تورکیا والله أعلم بەشداردەبن. لەم شەڕە کوشتارێکی زۆر ڕوودەدات و سوفیانی سەردەکەوێت، هەر ئەم شوێنە بەشوێنی دەعوەتی خوای گەورە دادەنرێت بۆ ئاژەڵەکان و باڵندەکان لە خواردنی گۆشتی زاڵمان، دوای ئەم ڕووداوە محمدی مەهدی دەردەکەوێت.



ئەوەی جێی باسیشە لەپێش ئەم ڕووداوە لەگوندێکی سەربە دیمەشق خەسف (ڕۆچوونی زەوی) ڕوودەدات کە والله اعلم لە گوندی "جابية" دەبێت. دوای ڕۆچوونی ئەم گوندە

لایەک لە مزگەوتی دیمەشق دادەڕمێت. پاشان ڕایەی سۆفیانی بەدەردەکەوێت کە لە (زاهیر) ڕووکەشەوە کەسێکی باشە، بەڵام لە ناخەوە شەڕە خەڵک پێی هەڵدەخەڵەتێت. هەروەها "بشار أسد" والله أعلم دوای گەمارۆدانی دەکوژرێت، پاشان شەڕە گەورەکەی بەناوی "قەرقیسیا" ڕوودەدات کە بەهۆیەوە زاڵمەکان یەکتری دەکوژن و کوشتارێکی گەورە ڕوودەدات کە دەبێتە دەعوەتی خوای گەورە بۆ ئاژەڵ و باڵندەکان لە گۆشتی زاڵمان. پاشان دڵخۆش دەبین بە دەرکەوتنی نووری چاومان ئیمامی ئاخیر زەمان.

لە کیتابی (الفتن لنعیم بن حماد) و هەندێک سەرچاوەی تر لەبەر درێژبوونەوەی بابەتەکە بەڵگەکانم دانەنا، بەڵام هەر کەسێک بیەوێت هەمووی ئامادەیە.

سبحان الله کە بەدواداچوون بۆ شەڕی "قەرقیسیا" دەکەیت هەست بە تەوافوقێکی عەجیب دەکەی لەنێوان سەرچاوە سوننییەکان و شیعییەکان و کیتابە ئاسمانیەکان لەسەر ئەم بابەتە.

# زنجیرەی یانزەیەم:

## ئایا کەسێک هەیە کە گومانی لێبکرێ محمدی مەهدی بێت؟

عائیلەیەک هەیە کە حکومەتی سعودیا زۆر ترسی هەیە لە کوڕەکەیان کە ناوی "محمد بن عبدالله الحودلی"یە و ناوی دایکی "ئامینەیە" و ئەصڵیان دەگەڕێتەوە بۆ "کەرعە" کە لە "یەمەنە" و بە بنەماڵە دەگەنەوە پێغەمبەر (ﷺ)، لە سعودیە لە دایکبووە. لەساڵی (١٩٩٠) لەگەڵ یەمەنییەکان تەرحیل کراوە بۆ یەمەن. لە ڕووی شکڵ و شێوە هەموو سیفەتەکانی مەهدییان لێ بەدی کردووە تەنها یەک دوو سیفەتێک نەبێت. هەربۆیە حکومەتی سعودیا ترسێکی زۆری لێ نیشت لەم کەسە. بێگومان دەسەڵاتدارانی سعودیا ئەوەندە شارەزای حەدیس نین بۆئەوەی ئەم شتانە بزانن بەڵام زانای دین فرۆشیان هەیە.

هەربۆیە حکومەتی سعودیا بڕیاری گرتنی ئەم کەسەی دا، بەڵام لەگەڵ برادەرێکی کە ناوی "ناصر"بوو ڕایانکرد، بەڵام "ناصر" کوژرا. محمد حودلی خۆی گەیاندە یەمەن و ئێستا هاربە لەدەست ئەم حکومەتە. حکومەتی سعودیا کە نەیتوانی ئەم کەسە بگرێت، هەڵسا بە گرتنی زیاتر لە هەشتا کەسەوە کە منداڵی بچووکی دوو مانگانی تێدابوو، دەستی کرد بە ئازار دانیان. هەروەک لەو ڤیدیۆیەدا دیارە کە لە خوارەوە لینکەکەیم داناوە. ئنجا بە برایەکی دەڵێن چونکە ئینقلاب لەسەر حکومەتی سعودیا دەکات و ئیعلانی حەرب لەسەر ئیسرائیل دەکات، ئەگەر بیگرن وەک جوهەیمان سەری دەبڕن. ئەمە ئەم حکومەتەیە کە زۆر لە موسڵمانان پێی هەڵخەڵەتاون و بە خەلیفەی موسوڵمانانیان دادەنێن! دەیانەوێت نوری ئێسلام لەسەر دەستی محمدیش بێت سەر هەڵنەداتەوە، خوا لە ناویان ببات. بۆ ڕاستی ئەم قسەم کە دەڵێم خوا لە ناویان ببات بگەڕێوە بۆ تەفسیری ئایەتی: ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ۝٨﴾[١].

نەک بگەڕێنەوە بۆ لای دین فرۆشەکان کە محمد بن سلمان بە خەلیفە دادەنێن، کە دەڵێت شتێک نییە بە ناوی محمد مەهدی، پار ساڵ لە مقابەلەیەک وای گوت. هەربۆیەش محمد مەهدی کە دێت خروجیان لەسەر دەکات و بەرەو دۆزەخ ڕەوانەیان دەکات لەگەڵ حاکمەکانی تر لە عەرەبەکان، (**تغزون جزيرة العرب فيفتحها الله لكم**)، شەڕی جەزیرەی عەرەبی دەکەن و فەتحی دەکەن. لەوانەیە هەندێک لە خۆشەویستیان بۆ خادم الحرمين خۆیان لە مەنهەجەکەی ئیمام بەری بکەن. کەسی حەق ویست دەبێت دوای حەق بکەوێت نەک قەولی ئەم و ئەو. بۆ خوا دەیڵێم ئەم سیفەتانەی کە لەم زنجیرە باسم کرد یەکدەگرێتەوە لەگەڵ بەشێک لە بابەتی زنجیرەی نۆیەم.

---

(١) سورەتی الصف : ئایەتی ٨

ئەمەش لینکی فیدیۆیەکەیە هیوادارم تا کۆتایی تەماشای بکەن: ( Google drive )

# زنجیرەی دوانزەیەم:

## ئایا محمدی مەهدی پێش دەرکەوتنی کەسێکی خراپە؟

### ڕاستکردنەوەی تێگەیشتن لە (یصلحه لله في لیلة):

بێگومان لە زۆری پرسیارەکان وا دەردەکەوێت کە ئیمام مەهدی دەبێت پێشتر کەسێکی خراپ بێت! ئەمە لەلای زۆرێک لە عەوام، هەروەها ئەهلی عیلمیش. ئەگەریش پرسیار بکەی بۆ پێتوایە؟ دەڵێت: چونکە (**یصلحه لله في لیلة**) واتە: لە شەوێك خودای گەورە دەیسولحێنێت.

سەرەتا با بگەڕێینەوە سەر قورئان بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە: خودای گەورە لە سورەتی الأنبیاء ئایەتی (٩٠) باسی خێزانی زەکریا علیه السلام دەکات کە منداڵی نەدەبوو: ﴿وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ﴾، لێرە مەبەست پێی ئیصلاحی جەسەدییە لەوەی کە منداڵی نەدەبوو، بۆئەوەی منداڵی ببێت. لەسەر قەولی زۆربەی موفەسیران، هەرچەندە هەندێک پێیانوایە کەوا ڕەوشتیشی باش نەبوو، بەڵام بەپێی ظاهیری ئایەتەکەش هەر مەبەست پێی منداڵ نەبوونە. بەپێی حەدیس و ئەثەر لەڕووی سیفەتەوە ڕەوشتی ئیمام لە هی پێغەمبەر (ﷺ) دەچێت، بەڵام لە شکڵ و شێوە لە ئەو ناچێت. باشە کەسێک ڕەوشتی لە پێغەمبەر (ﷺ) بچێت، چۆن دەکرێت لە شەو و ڕۆژێك وەک پێغەمبەری (ﷺ) لێ بێت؟!

بێگومان ڕەوشت بە شەو و ڕۆژێك وەک هی پێغەمبەر (ﷺ) لێ نایات. وەک سوننەتی ژیان، تەنانەت صەحابەکان کە لەگەڵی دەژیان دوای موسڵمان بوونیشیان بە ماوەیەکی زۆریش هەر هەندێک ئاسەواری جاهیلی مابوو لای هەندێک، ئەمەش باسێکی ترە. لە

ڕووی عیلمیشەوە ئیمام کەسێکی زانایە، هەروەها کەسێکی پتەو و بەهێزە لە ڕووی جەستەوە. کە ئەم دوو سیفەتەش سەڕەرای سیفەتی پێشتر وەک سوننەتی ژیان بە شەو و ڕۆژێک بەدەست نایەن.

شێخ "ئەلبانی" لە شەرحی (**يصلحه لله في ليلة**) دەڵێت: واتا خودای گەورە موهەیەئی دەکات بۆ ئەمری خەلافەت و سەرکردایەتی ئوممەت.

والله اعلم هەرچەندە بە دوور نییە کە سیفەتی ڕەوشت و عیلم و جەستە بگات بەوپەڕی، بەڵام ئەوەی کەوا لە هەمووی پەسندترە بۆ کەسێک کەوا ئەم سیفاتانەی هەبێت بریتییە لە ڕەخساندنی (سوڵحاندنی) بۆ سەرکردایەتی هەموو جیهان، واتا ئەمری خەلافەت. چونکە هەر موهیممە و ئەرکێکی گەورە سەرەڕای تەوفیق سوڵحاندنیشی پێویستە. هەروەک پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەرەڕای سوڵحاندنی یەکەمی جەستەیی بۆ پێغەمبەرایەتی لە دەرهێنانی بەشی شەیتان لە دڵی. کاتێک خوای گەورە ویستی ئیسراو میعراجی پێ بکات سوڵحاندنێکی تری جەستەیی بۆ کرد، لەڕێی جبرائیل علیه السلام لە کردنەوەی سینگی و شوشتنی بە ئاوی زەمزەم. پاشان ڕووکردنی ئیمان و حیکمەت تێیدا پاشان داخستنی و پاشان بەڕێکەوتن بۆ ئیسراو میعراج. کەواتا ئێستا ڕوونبووەوە کە سوڵحاندن تەنها بۆ کەسی فاسق و فاجر نییە.

لێرە شتیکی تریش هەیە لە ڕوونکردنەوەی (**في ليلة**) کە لەوانەیە مەبەست پێی تەنها شەوێک نەبێت، لەوانەیە مەبەست پێی هەمان شەوبێت لە ڕووی دووبارەبوونەوە. بۆ نمونە، کە پێغەمبەر (ﷺ) دووشەمان بەڕۆژوو دەبوو، دەیفەرموو چونکە لەم ڕۆژە لە دایک بووم، نیگا (وەحی)ـم بۆ هاتووە، تێیدا کۆچم کردووە. "ابن عباس" دەفەرموویێت: (حجر الأسود) هەر لە دووشەمە بەرزیکردەوە بۆ شوێنی خۆی، هەروەها مردنیشی هەر کەوتە دووشەمەوە. لەبەرئەوەی لەم حەدیسە (**ليلة**) بەشێوەی (نكرة) نەناسراو هاتووە دەکرێت مەبەست پێی

ڕووداني شته گرنگەکانی ئیمام لەژیانی بکەوێته شەوەکانی دووشەمەوە یان هەر شەوێکی تر بەنمونه.

بۆیه وابیرنەکەینەوە کە ئێمەی جاهیل خەمی ئەم ئومەته دەخۆین و بیر له ڕزگاربوون دەکەینەوە لەسەر دەستی ئیمام، ئەویش بۆ خۆی به خراپەوە مەشغوڵه، ئنجا له پڕ خوا دەیکات به وەلی و زانا و دانا و سەرکردە. (هذا لعمري في القياس بديع)، بەڕاستی ئەمه زۆر عەجیبه. خوا ئەم شتەی به پێغەمبەر (ﷺ) نەدا ئێمه بۆ ئیمام چاوەڕێی دەکەین. ئەمه بەکورتی بوو بۆ ڕوونکردنەوە. والله أعلى و أعلم.

# زنجیرەی سیانزەیەم: وەڵامێک بۆ مامۆستا هاوڕێ.

دیارکردنی حەقیقەتی محمد مەهدی.

- لەڕێی ئەم بەستەرەوە بینەری بەشی یەکەمی وەڵامدانەوەکەبە لە یوتوب
- لەڕێی ئەم بەستەرەوە بینەری بەشی دووەمی وەڵامدانەوەکەبە لە یوتوب







# زنجیرەی چواردەیەم:

## ڕاست هەڵەیەک سەبارەت بە دەرکەوتنی شاخە ئاڵتونیەکە.

هەموومان وا تێگەیشتبووین کە هەتا چیایە زێڕەکەی ناو ڕووباری فوڕات دەرنەکەوێت ئیمام مەهدی دەرناکەوێت، بەڵام لە حەقیقەتدا بەپێی حەدیسە سەحیحەکەی کە باسی ئەم چیایە دەکات، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: قیامەت نایات تاکو ئەم چیایە دەرنەکەوێت. کەواتە پەیوەندی نییە بەهاتنی مەهدی، بەڵام بەپێ حەدیسە زەعیفەکان وا دەردەکەوێت کە ئەم چیایە بە کاتێکی زۆر کەم پێش مەهدی یاخود هاوکات دەبێت لەگەڵ دەرکەوتنی ئیمام، بەڵکو فەراغێکی سیاسی دروست، دەشکرێت پاش هاتنی ئیمام بێت.

پێشتر لە زنجیرەی دەیەم باسم کردووە، بەپێی ڕیوایەتێک. هەرچەندە هەندێک لە زانایان پێیان وایە کە ئەم چیایە زێڕە مەبەست پێی نەوتە کە کاتی خۆی کە صدام حسین ڕێڕەوی

ڕووباری فوڕاتی گۆڕی بیره نەوتەکانی لێدا. بەهەرحاڵ، زۆر پرسیار دەکرێت و وا باوە کە ئەگەر ئەم چیایە دەرنەکەوێت ئیمام نایات بۆیە بە پێویستم زانی ئەم شتە ڕاست بکەمەوە.

قال رسول الله (ﷺ) : (**لا تقوم الساعة حتى يُحْسَر الفرات عن جبل من ذهب يقتتل الناس عليه ، فيقتل من كل مئة تسعة وتسعون ، فيقول كل رجل منهم : لعلي أكون أنا أنجو**)[١].

فانتظروا إني معكم من المنتظرين.

ألا إن الحق في آل محمد.

(١) رواه البخاري

بەرهەم هاتووە لەلایەن پڕۆژەی نوری ڕێ کاردەکات لەپێناو خزمەتکردنی ئیسلام و بیروباوەڕ و دەنگی تەوحید و قورئان و سونەت و خزمەتی موسڵماناندا



# باسێکی کورت سەبارەت بە کتێبەکە

"لە زنجیرە باسی محمد مەهدی إن شاء الله لەو حەدیثانەوە دەست پێدەکەین کە بەشێك یان بەشێکی زۆر لە حەدیثەکە هاتووەتەجێ و بەشێکی کەمی ماوە لە واقع بیبینین. بۆئەوەی گەورەیی ئەم دینە بزانین لە باسکردنی موستەقبەل و ئومێد لە دڵی موسڵمانان بڕوێتەوە. هەروەها دڵە نەخۆشەکانیش بزانن کەوا ناکرێت بڕوات بە حەدیث نەبێت. واتا بە غێر موباشەریش وەڵامێك بێت بۆ ئەوانەی بڕوایان بە حەدیس نییە"

بەشێك لەپێشەکی نوسەر